# سەید ئیبراهیم ستوودە

بەهارە وکاتی بەزم وجامی گوڵڕەنگ
بەڵام گوڵ سینە چاکە وغۆنچە دڵ تەنگ
بەجێ یە گەر بڕێژێ چاوی گەردوون
بەسەر چاوە وچیادا ئەسری گوڵڕەنگ
وەنەوشە مل کزو سۆرانی شینە
زمانی سوێسنی شیرین زمان ، لەنگ
چلیخانەی دڵی ناسک خەیالان
پەشێواوە وەکوو توغڕا بە چلچلەنگ
بەڵێ رەنجی جیهان ژەنگی دڵانە
دڵ ئەگەر ئاسن بێ ئاسانکونی ئەکا ژەنگ
" هەوارگەی خاڵی " وێنالەی جودایی،
بەشیوەن سازدەکەن شوورو نەوای چەنگ
نەوای شین ، نازی نەورۆزی گوڵانە
لەزەخمەی چەرخی چەپگەردی کەج ئاهەنگ
لەگڵ دەرهاتووە ئالای سپای گوڵ
بەڵام شای وێژە گڵکۆی کردە ئەورەنگ
زمانم لاڵ دەڵێن چەرخی چەمەر پشت
هوسای من " هێمنی " بردووەبەنەیرەنگ
دریغا هێمنی شیرین زمان چوو
خودانی شەوق وزەوق وفام وفەرهەنگ
نیە هاوگەوهەری شیعری لەتیفی
مەگەر ئاونگی سەرکوڵمی گوڵی شەنگ
نەبوو هاوڕەنگی رەیحانی خەتی وی
مەگەر موشکی تەتەر ، یا ، نەخشی ئەرژەنگ
بەچوونی ئەو ، نەهات هات ،هات لەدەس چوو
چ ــات وجۆبە ئەی بەختی سیارەنگ ؟
لەپێی ئامانجی هۆزی خۆی نەترسا
لە دەردو رەنج و کۆسپ وبەندوسەرچەنگ
" ستوودە " مەرگی هێمن کاسی کردی
مەنات ناکەم ئەگەر ماتی، ئەگەرمەنگ
لە دڵ بەردیت بوو قەدری ویت نەزانی
بەڵێ بێ بایە گەوهەر لەلای سەنگ

# شێخ عەبدولکەریم هیرانی

ماڵی وێرانم بۆ بەختی رەشی کورد کەی زانراوە لە بەهاردا گوڵ هەڵئەوەرێ بولبول بێ دەنگ ببێ ؟!! بەڵێ بەهاری ئەو ساڵەشمان پڕ لە غەم و پەژارە بوو بەتایبەتی بۆ هونەردۆستان بەهۆی کۆچی دوایی ئەو شاعیرە مەزنەوە.

بەهاری ئەوساڵەشمان کە ساڵی "٩٨٦" ە داخی گرانم داڵێکی پڕ لەخۆشەویستی کورد و کوردستان لە لێدان کەوت و تەرمی ئەو شاعیرە مەزنە خرایە باوەشی خاکی پاکی کوردستان .

سەر هەبێ شاعیر لەناو کوردا بەڕاستی هێمنە
خۆشەویستی ئەو هەمیشە والەناو هەستی منە
شیعرەکانی وەک چرای رووناکە بۆرێگەی خەبات
نووکی خامەی ئەو بەوێنەی چقڵی چاوی دوژمنە
مەردی مەیدانی خەبات وبولبولی باغی هونەر
شاعیرێکی پایەبەرزو بیروباوەڕ رۆشنە
هێمنی شاعیر لەناو کورد ناوی هەرگیز نامرێ
چونکە خاوەن بەرهەمێکی پڕ لە سوودو شیرنە
چی بکا وریا لەبۆ ئەو شاعیرە هێشتا کەمە
داخەکەم هیچ ناکرێ رێگای هەموومان مردنە

# هێمن نامرێ

د.بیده شێخێ

رۆژی حومعە رێکەوتی ٢٩ی خاکەلێوەی ١٣٦٥ ی هەتاوی . دیسان ئاسمانی کوردەواری تەم گرتی،دیسان ئەسرین رژا بەسەر کۆشی دایکی مل بەکوێن ،دیسان روناکبیرو دلسۆزی کورد دەستی لەرزی وهێزی ئەژنۆی لێ برا ، دیسان دلی لە حۆشی ئاورین بۆ لەپێش چاوی کوورەی خاکی بەئاواچو ، دیسان تارمایی بەسەر چاوانی کشا وبلبیلەکانی چاوی سۆمایی یان لێ برا ،دیسان چرای قوژبنی فێرگە فووی لێ کراو رێگا بەرەو زەلکاوی نەزانین خۆش کرا ،دیسان دلی نەوەستاوی شاسواری مەیدا ـ نی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی لەناو گۆڕی سارد و تەنگەبەردا سەری نایەوە ، دیسان تاکە سوارەی مەیدانی خەبات وتێ کۆشین بوو بە میوانی خاکی بێ باکی مەهاباد ،دیسان قاسپەی خاسەکەو لە گەرووا خنکایەوە ،دیسان کۆڕی شین گیرایەوە والفاتیحە دادرایەوە .

**دەک فەلەک تەختت وەرگەڕێ**
**ئاگر لە بەختت هەلگەڕێ**

ئیتر ئەوجار خۆراگرتن ناکرێ،ئیتر ئەوجار دل ناسرەوێ، ئیتر ئەوجار بێ ئیختیار رێژنە بارانی فرمێسکی دلسۆزی کورد رێچکە دەبەستن ئیتر ئەوجار خوێنی گەشی چاوی وردبینی کوردە کە جۆگەلە بۆ جۆمالی جوتێری کورد هەل دەبەستن ،ئیتر ئەوجار دلخۆشی دانەوەی دایکی نیشتمان ناکرێ ،ئیتر ئەوجار ئاسۆی روونم لێ بۆتە تاریکایی شەوەزەنگ .

تەنانەت ئەوجار ئاسمانی رەنگ پەڕیو و بزرکاو بێ دەنگی خۆی دەشکێنێ وهاوارێ لەگەل گەلی زۆرلێکراو وچاو بەفرمێسکی کورد بەدلی پڕ لەداخ و پەژارەوە لووزووەی فرمێسکان بەسەر مەکۆی خۆشەویستی ئەو هێژاوبلێمەتەدا دەپڕژێنێ وبلێنی پشکووتنی خۆنچە گولی باخی ئەدەب بۆ سەر گۆڕی ئەو رۆلەیە دێنێ .

( ئیشارە بەبارانی رۆژی حومعە ٢٩ی خاکەلێوەی ١٣٦٥ ی هەتاوی لەشاری مەهاباد کە چەند دلۆپێک باری )

بەلام خاک سەری شەرمەزاری وخەجالەتی بەرداوەتەوە ودەزانێ هەتاهەتایە بوێر و دلسۆز وخاوەن هەستێکی وای بۆ پەروەردە ناکرێتەوە ،لێی سوور وروونە تاکە شوانەی ئەو گەلە هەژارە جێی پڕ نابێتەوە .

ناچار وەدەنگ دێ وهاوار دەکا و دەلێ :

ئەی خاک بەسەرم تازە بروەی وا هێمن و بۆ فێنک کردنەوەی هەناوی سووتاوی ئەو گەلە هەژارە لەکوێ بەدی کەم ؟ بۆنی پێوەکەم ، کولی دلی پێدا بمرکێنم ،ئیتر ئەوجار بوێژو خاوەن قەلەم ودلسۆزی وا چۆن پەروەردە کەم بوێرن وبلێین :

**بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم**
**دوندی قەندیل ،گۆڕەپانی هەلگۆرد نیم**
**بەرەوبەرزایی دەچم گەرچی وردم**
**خاکی بەر پێی تێکۆشەرێکی کوردم**

خوایە چبکەم ، روو لەکوێ کەم ،سۆزی دەروون

چۆن دەربرم ، ماموٚستای خۆشەویست گوتەنی :

**چۆن نەنالێ ئەو دڵەی پڕ هەستی من**
**چۆن لەئەژنۆ ببنەوە دوو دەستی من**
**چۆن نەنالێ ئەو دڵە ئەنگاوتەیە**
**بەرد لە بەردی بێتەوە دەنگی هەیە**

خەریک بووم بەوێنەی مەجنوون رووڵە چۆڵ و چیا کەم ، خەریک بووم بە سۆفی گۆشەی خانقا یا بە پیری مەیکدە بم ،خەریک بووم بە جارێک لە ژین ناهومێد بم ،کەچی لەپڕ بانگی کردم :

رۆڵەم ،هیوای دوارۆژم ،هێژایی و ئاواتی بیرم ! چ بوو؟! ئەو دەنگە ئاشنا و بە تینە هی کوێ بوو؟! خوایە گوێم زرینگایەوە یا خەون بوو ؟! .

نانا ، دەنگی زولاڵ وئاسمانی ئەوینمە ، دەنگی خۆشەویستمە ، دەنگی رووناک کەرەوەی رێی ژیانمە ،دەنگی پیری رێی خەبات ماموٚستا "هێمن"ە بانگم دەکا ودەڵێ : لەبیر مەکە خۆم پێم گوتووی :

**کیژوکوڕ بگرن لەدەورەی گۆڕی هێمن**
**رەشبەڵەک**
**من کە شین گێری شەهیدانم لە کۆی**
**شینم دەوێ**

مچوڕکێک بە لەشمدا هات ، کەللەم تاسێ ، بۆ ماوەیەک گێژو هوڕ بووم ، فرمێسکەکانم کە هەروا رێچکەیان بەستبوو بەبێ ئیزن وەستانەوە .ئەوجار دڵ بۆماوەیەک لە تەزین کەوت وسرەوی،ئەوجار کۆڵەباری قورس وقەوەت بڕی خەم وپەژارە لەسەر شانم خزین، مەینەت و ناهومێدی بارگەیان تێکەوە پێچا و کۆچی دوایی یان کرد.ئاخر دەنگی خۆی بوو . بەو دەنگە نەبا دڵ نەدەسرەوت ، دەستی لەرزۆک قەڵەمی نەدەگرت ،مێشک نەدەحەسایەوە ، دەردو کەسەر بوخچەیان تێک نەدەنا ، دڵ شادنەدەبوو رووح نەدەگەشایەوە .

گفتی شیرین هەروا لەگوێمدا دەزرینگاوە تا لەپڕ وەگوێی دڵم کەوت وئەوجار بۆهەمیشە خەسامەوە وبڵێنیمدا کۆڕی رەشبەڵەک چۆل نەکەم ونەهێڵم دەسرەی سەرچۆپی لە دەستان بکەوێ بەو مەرجە گۆرانی ئەو رەشبەڵەکە ئەمە بێ :

## ف. محەمەدی

**دڵە هەڵقرچە دەسا، دیدە بەخوڕڕەم بگری**
**شین کە سۆرانی گەلۆ، هەوری خەفەت بۆکزری**
**بووکی وێژە هەقە گەر بدڕی بەرۆکت ئەمڕۆ**
**کۆچی بێ وادەی هێمن هەرەسەختە زەبری**
**کاری ئەمڕوی نیە پیلانی لەمێژی چەرخە**
**تا دەگا دەستی ئەدا چڕ ئەنوێنێ غەدری**
**هێمنی ئێمەیەوا نووستە لە سینگی تنۆدا**
**"گڵە مەرگت بێ ئەگەر گەرمی لەباوەش نەگری"**

**شیوەنی من شیوەنی ئینسانی یە**
**بانگی ئازادی وگڕوی یەکسانی یە**
**شیوەنی من شینی کوردی بێ بەشە**
**ئەو گەلەی حاشادەکەن لێی وەشە**

ماموٚستا هێمن لە کتێبی (پاشەرۆک)کە باسی فەقێ ساڵحی حەریق دەکا دەفەرمووێ :

" مرۆڤ لەسەردەمی لاوەتی وبێ ئەزموونیدا زۆر پابەندی بیروبڕوای خۆیەتی با بیر و بڕواکەشی لەگەڵ ئەقڵ و زانست وفەلسەفە زۆر یەک نەگرنەوە" بەڵام من هەرچەند لاوم زۆر لە خۆم ولە نووسینی خۆم ڕازی نیم ئەگەر رێم بکەوێ هەر بۆ ئەو چەند دێرە دەمەلاسکەی ماموٚستا ( هەژار) بکەمەوە و دەڵێم :

چاک بێ یان چرووک بێ ..... هەرئەوەندەم لە دەستهاتووە و هەرکەسیش هەڵەم بۆ ڕاست کاتەوە وپەڵەم بۆ هەڵ گرێ وشڕەم بۆ پینە بکا سوپاسی ئەکەم .

# جوغرافیای شارستانی بانە

ڕەئووف وسووقی
حاجی ڕەئووف سەلیمی

هێندێک لە گوندەکانی شارستانی بانە وەک **بلەکێ** و **ئالۆت** و **ورچەک** و **تاژان** و **تاژەنبان** و **کانی گوێز** جگەلە کشت وکاڵ وئاژەڵداری باخدا- ریش دەکەن و**ترێ** و **هەرمێ** و **هەنجیر** و **توو** و**بەهێ** ڕەعەمەل دێنن و لە بازاڕی شاری بانە دەیفرۆشن .هێندێکی تر لە گوندەکان لە نزارو دارستانی خۆرِسک **گەزۆ** و **مازوو** و**تاڵ** و **بنێشت** دەگرن ولە گوێنی **کەتیرە** دەگرن .

کشت و کاڵ :

بەشی زۆری کشت وکاڵ بریتی یە لە **گەنم** و **جۆ** و **نۆک** و **ماش** و**تووتن**و **پەڕشە** .وهێندێک تەڕەکاڵ وەکوو **خەیارو** **تەماتە** **گرکە** وشووتی کەبەشی خواردنی خۆشیان ناکا ڕەعەمەل دێنن . لە دەرەوەی شارستان **قەند** و **ڕۆنی نەباتی**و **ئارد** و **میوە** و **سەوزی** و خواردەمەنی دیکە دێنە ناوچە و بازاڕیان زۆر گەرمە .

کان و مەعدەن :

لە شارستانی بانە هیچ چەشنە کانێک تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە . لەبەر ئەوە هیچ کارگەیەک لەمشارستانەدا نیە بەڵام دەوڵەت دەتوانێ بۆ لەنێو بردنی بێکاری چەند کارگە ، کەمەوادەکەی هەر لەم شارستانە وەدەست دەکەوێ دابمەزرێنێ وەکوو **دوخانیات** **رستن وتەنین** ، **چەرمخۆش کردن** **پێڵاو سازکردن** و . . . .

دەستکرد :

ژنان لە گوندەکانی شارستانی بانە جگە لە کاری ماڵ و ڕەعەمەل هێنانی مەڕ و ماڵات و شیروماست وسپیایی و مەشکەژاندن بریتی یە لە : **شەی خوری** ، **تەشی رستن** . لە بەعزە جێگەیەک **جاجم** و **بەڕەو** **بەرماڵ** و**تەون**و **ڕەشکە** و **جەواڵ** و **خەرار** و**گوریس**و**گۆرەوی**همیە لەگەڵ ئەوەش لە مووچە و مەزرا یارمەتی پیاو دەدەن و لە گوندەکانی بناری کێو ڕۆژێ دوو سێ سەعات دەچنەبەر بێر و مەڕدەدۆشن. وەختی بێکاریش دەچنە سەر چاک و پیران وەکوو **شێخ ئەحمەدی ساوان** ،**مەلا مووسای تەوەکەڵ** و **مەرقەدی سورین** .

بێکاری تەهێنی :

پیاوەکان هەرچەند بەرواڵەت خەریکی کشت وکاڵ و ئاژەڵدارین بەڵام زوربەی ساڵ بە بێکاری رادبوێرن و ساڵێ شەش مانگ بێکارن . ئەم بێکاری یەی خۆیان زستانان بە راوەستانی سەربان و**حەوەڵێن** و خۆ لەبەر تاو هەڵخستن و **جۆرابێن** ونەقلّ ونەزیلەی بن کورسی و کوورەی گەرمی مزگە- وتان پڕ دەکەنەوە .

**ڕێ و بان** :

ڕێگای نێوان گوندەکان و ڕێگای گوندەکان بۆشار شووسە نیە و خیزڕێژ نەکراوە و لە

زستاندا ماشێن لەبەر قوڕ و زەلەق دەرناچێ . تەنانەت ڕێگای نێوان شارەکانی **بانە مەریوان** ، **بانە۔ سەردەشت** ، **بانە۔ سەقز** ، قیرەتاو نیەو قەرارە قیرەتاو بکرێن . ماوەیەکە لە**کەلیخان** خەریکن تونێل لێ بدەن بەڵام تەواو نەبووە . ئاشکرایە ڕێ و بان شوێن لەسەر وەزعی ئابووری و کۆمەڵایەتی ناوچە دادەنێ .

خواردەمەنی :

خواردەمەنی لەگوندەکانی شارستانی بانە بەهاران زیاتر گژ وگیای بەهاری یە وەک : **کەنگر و گێلاخە و پێچکەوکوراده** و شتی وا . هاوینان **شیر** و **ماست و دۆ و دۆکلێو و شیرێژە** . پایز وزستان **پەنیرو دوێنە و برۆیش وماشێنەو ترخێنەو** و هێندێک دانەوێڵەی دیکەیە . ئەم خۆراکانە **ویتامین و کالۆری** یان کەمە .

خۆراکی خەڵکی شاری بانە لەچاو گوندەکان بەوەجترە و زۆرتر سەوزی وگۆشت و میوە دەخۆن یانی وەزعی ئابووری یان لەگوندنشینەکان باشترە .

شوێنەوار :

شوێنەوارەکانی بانە بریتین لە قەڵا و تەپۆڵکە و ئەشکەوت و شوێنەواری شارە کۆنەکان کەهێشتا هەڵنەکەندراون تا روون بێتەوە سەر بەچ دەورەیەکن .ئەگەر کۆنینەناسلێی بکۆڵنەوە شت وەکی

عەنتیکەیان لێ وەدەر دەکەوێ. خەڵک بەپاچ وپێمەڕە خەریکی هەڵکۆڵ هەڵکۆڵن و زورێشیان شت دیوەتەوە وەک **کووپەی گەورە ،سواڵەت ،ملوانکە بازنە ، خەنجەر ، شمشیر ،کلکەوانە** ، بە تایبەتی قەڵای زێویەی بانە ئاسەواری لەزۆر جێگا وەدیار کەوتووە .

چەند قەڵای دیکەش وەک : **قەڵای نژۆ ، شوێ ، زێویە ، رەشەقەڵات** .لەبانە هەیە کە خەڵک پێیان وایە شوێنەواری چەرخی پێش **ئیختیاردینی** یەکانە وپێیان دەڵێن **قەڵای قەقۆ** . تەپۆڵکەکانیش زوربەیان تورەکە ڕێژن یانی فەرمانڕەواکانی پێشوو خەڵکیان بە بێگاری گرتووە وبە کۆڵ گڵیان پێ کێشاون تا ئەو تەپۆڵکانە پێک هاتوون .

ئەشکەوتەکانیش بریتین لە **ئەشکەوتی شوێ ، ئەشکەوتی رەشە قەڵات ، کۆنە قاژاو** .

ئاسەواری شارەکۆنەکان لە زۆر جێگا ماون وەک **چێچۆران نژۆ ، بەرۆژە کون** .

زانایانی بانە :

بانە زانای بەناوبانگی لێ هەڵکەوتووە وەک **مەلاموسا تەوەکەل ، مەلا محەممەدی بەردەرەشی ، مەلا محەممەدی بانەیی** و چەند زانای دیکە.

شاعیرانی بانە :

لەنێو شاعیرەکانی شارستانی **بانەوەستا حەمەمینی دەلاک** کە شەڕی **ئەردەلان وبابان وئیختیاردینی** و تیرەکانی دیکەی وەکوو **شانامەی فیردەوسی** بەشیعر نووسیوە لەهەموان بەناوبانگترە .دوای ئەو **سەیدئەحمەدی خواجەمیری** بە نازناوی ئەدیب ، شاعیری پایەبەرزی ئەو هەرێمەیە ....

سەرچاوەکان :

١۔ ئامووزش وپەروەرش
٢۔ شارەداری بانە .
٣۔ دارایی بانە .
٤۔ تەعاونی .

تەواو

# مەلاخدر دەشتی

## " ئەحمەد دەشتی "

دەشتی لەساڵی ١٩٠٩! لەدایک دەبێ ولەساڵی ١٩٥٧ زاینی بۆ هەمیشە ماڵ ئاوایی لە نیشتمان وگەلەکەی دەکاو لە گوندی "خرابەدراو"ەکە ٢٠ کیلۆ مەتر لەشاری هەولێر دوورە لە ناوچەی بەرانەتی لەکوردستانی عێراقدا بەخاک دەسپێرێ .

ماموستا مەلا خدر ماوەی ١٦ ساڵ لەگوندی دارەبەن هەر لەو ناوچەدا مەلایەتی کردووە وماموستایەکی دڵسۆزو بەوەفا بووە لەگەڵ قوتابیە-کانیدا کە لەو ماوەیەدا هەمیشە بیستسی فەقێ و مستەعیدی لێ کۆبۆتەوەودەرسی پێ گوتوون وئیجازەی مەلایەتی پێداون ،بەهۆی زیرەکی و دڵسۆزی یەوە هەمیشە لەهەموو لایەکەوە فەقێیەکان روویان کردۆتە دارەبەن ولەلایەن ئەو ماموستا مەزنە دەرسی فقە و شەرع ومەنتیق ونەجوو سەرف و بەلاغەیان خوێندووە هەتا دوا دەرسەکانی مەلایەتی، جگە لە دەرس گوتنەوە دەشتی هەمیشە گرنگی داوە بەنوێژی جەماعەت و بەتایبەتی رۆژانی هەینی مزگەوتی گوندی دارەبەن ژاوەی هاتووە ولە زۆربەی گوندە دراوسێکاندا دەهاتن و بۆ رۆژی هەینی گوێیان لەخوتبەو قسەکانی ئەم مرۆڤە مەزنە رادەگرت . ماموستا خدری دەشتی هەمیشە بەزمانی شیرینی کوردی خوتبەی دەخوێندەوە و باسی سیاسەتی ئەو سەردەمەی دەکرد ولەزۆربەی خوتبەکانیدا باسی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن ویەکێتی نێوان ریزەکانی گەلی کوردی کردووە هەمیشە بەربەرەکانی زۆرداران و چەوسێنەرەکانی لەرۆڵەکانی میللەتەکەی داوا دەکرد .

دەشتی زمانی عارەبی و فارسی وتورکیشی لەپاڵ زمانی زگماکی خۆی زۆر بە باشی زانیوە وتوانای قسەپێکردن و شعرونووسینی بە هەر سێ زمانەکەی دیکە بووە .لەلایەن هەزاران وجوتیارەکاندا ئەو پەڕی رێزی لێ نراوە ، هەرگیز سەری بۆ زۆردارەکان شۆڕ نەکردووە ،چاونەترس و ئازا بووە .

دەشتی لەماوەی ژیانیدا جارێک سەفەری حەجی کردووەولە شاری مەکە ومەدینەدا هەندێ شیعری زۆر بەسۆزی لە مەدحی پێغەمبەر وگەورەیی ئەومرۆڤە مەزنەدا فەرمووە .

بەرهەمەکانی دەشتی ئەمانەن:

١- دیوانی شیعر ، کوردی عەرەبی ،فارسی ، تورکی و بەشێوەی کرمانجی سەروو هەندێ شیعری گوتووە .

٢- مەولوودنامەی کوردی بە شیعر .

٣- باوەڕنامەی کوردی بە شیعر .

٤- ئیستعارە دەربارەی

عیلمی بەیان بە عەرەبی بە شیعر لەسەر وەزنی (الفیەی) ابن مالکە .

٥ـ تەلاق نامە بە زمانی کوردی .

دیوانی دەشتی بریتیە لە ١٠٠ شیعری کلاسیکی بە زمانی کوردی وعەرەبی و فارسی و تورکی. دەشتی ئاشنایی بەکی تەواوی هەبوو بەهەر سێ زمانەکەی بەتایبەتی لەزمانی عەرەبیدا زۆر زاناو بلیمەت بووە .

شیعرەکانی دەشتی بریتیە لە شیعری عیرفانی ونیشتمان پەروەری ودلداری . زۆرجێگەی داخە کە زۆربەی شیعرە نیشتمان پەروەریەکانی دەشتی نەماون وفەوتاون ئەمەشی لە کاتێکدا کە بەهۆی ماموستا گیو موکریانی ناردمانە بەغدا بۆچاپکردن

بەرێزەی ئەشکی خوێنینم کەوا هەمتاق وهەمجووتن
لەنێو بازاڕی ڕۆحانی مەلائک مات و مەبهووتن
فەلەک سەد دەورە ڕۆژی زێو لەمیزان‌دا دەنێ‌بۆیێ
گولستان وگوڵ وشەوبۆ لەبەختی من هەموو سووتن
تەماشا کەن لەبانی خونچەیارم گەر تەبەسوم کا
لە نەزمی پڕ سەدەفیا چونکە زمڕووتن لەزەمڕووتن
چراغی هەم گوڵی بۆیی دەڵێن پەروانە وبولبول
لەداوایی شەب وزولف وبەیانی سینە پەڕپووتن
دڵی مەهجور و غەواسی دوسەد جەیحوون جەدەلبازن
لە باسی لێوی ئاڵی تۆ کە یاقووتن وەیا قووتن
کەتوم ناسی ئومێدم چۆن بەجانی خۆم هەبێ جانا
کە زامۆزەهر وبێ ڕەحمی لە دەرحەق عاشقاخووتن
دەبێ ئەشتەر وەکوو دەشتی هیلاکی فرقەتی بووبێ
ئەگەر نا جۆنە زولفی کافرت هەردەم لەسەرڕووتن

بەڵام جگە لەوەی کە روخسەتی چاپیان نەدا زۆربەی شیعرە نیشتمان پەروەریەکانی بەسۆزیان دەرهێنا وفەوتاندیان هەرچەندە لەگەڵ خوالێ‌خۆشبوو ماموستا گیوی موکریانی زۆریشمان هەوڵدا وەگیرمان نەکەوتنەوە ،کەبە کەلێنێکی زۆر گەورەی دەزانم لەدیوانی ئەم هونەروەرە مەزنەدا ئەمەش هەر دەگەڕێتەوە سەر چەپەڵی و زۆرداری ڕژیمی کۆنەپەرستی عێراق بەرامبەر بە گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا .

غەریب ودڵ حەزینم شینە بۆمن جەژنی قوربانم
قوڕی سەربان بەبانی سەربکەم بۆجەژنی قوربانم
هەموو کەس ئیمڕۆ وادەستی جەبیبی خۆی لەدەستایە
وەلێ من بێکەسم بۆیێ شەڕابی غەم لە دەستانم
هەموو عالەم کراسی غەم‌ئەسووتێنێ بە کەیفی دڵ
منی پڕ غەم بە عەشقی دڵ خەریکی سینەسووتانم
لە گفت وگۆیی ئەحبابم بەجارێ بێ خەبەر ماوم
لە کونجی میحنەتا مەستی فراقی چاوی یارانم
لەباتی جەژنە پیرۆزی دڵم کەیفی لە گریانە
لەبەر دووری لەباب و داک و هەم یاروڕەفیقانم
وەلێ هەر خوا بەخۆی کاری عیبادی خۆی ئەزانێتن
وەکوو (ابن الروندی) با نەکەم تەنقیسی ئیمانم
بە دەشتی قەت مەڵێن بۆچی قسوورت کرد لە گریانا
قسوورم خۆ نەکرد خوێنی بەدەن چک بوو لەچاوانم

**گەنمانی مەهاباد: کاک رەحیم قادری :**

باسی یەکەمین کۆنگرەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی لە گۆوارێکدا بڵاو دەبێتەوە. گۆواری سروە فەرهەنگی ئەدەبییە وباسی ئایینی و موناجاتیشی هەمیشە تێدایە زمانی کوردی شاری بۆکان و مەلبەندی فەیزوڵڵا بەگی رەسەنە ولە زمانی یەکگرتوو زۆر نزیکە. هیواداریـن بتوانین داخوازەکانت پێک بێنین.

**سەقز: مامۆستا مەحموود ئیبنولخەیات :**

بەسپاس لە نامەکەت، هەروەک دەزانن ئێمە لە سروەدا باسی دینی وموناجاتمان هەیە بە هیوای خوای میری مەزن نایەڵین ڕەنگی هێمن لە سروە بێتەوە وهەروەک فەرمووتانە زیاتر لە نامەکان ورد دەبینەوە.

**سەقز: حاجی رئووف سەلیمی:**

جوغرافیای شارستانی بانە لەسروەدا بڵاو بۆتەوە و کتبی "بانەوهیروشیمای دیگر" خەریکە بۆچاپ ئامادە دەبێ وەبیر هێنانەوەی هەڵەی چاپی لەسروەی ژمارە ۷ دا جێگای رێزو سپاسەهیواداریـن تا ئەو جێگەی دەتوانین دووپاتەیان نەکەینەوە.

**سەقز: عادل**

باسێکی زۆر جوانت گێڕاوەتەوە. ئەوە ڕەسمی کۆنی باب وباپیرانی ئێمەیە نووسیوتە "کوڕێک چووەتە خوازبێنی کچێک، باوکی کیژەکە گوتوویەتی: مارەیی کچەکەم تەنیا ئەوەیە قورئانی فێر بکە وبەس. هیواداریـن زۆر کردنی مارەیی کەکۆسپێکی هەرەگەورەی بە، یەک نەگەیشتنی دوو دڵە لە نێو بچێ وهەموو بەمئەرکەی پێمان سپێراوە شارەزابین و ئەرکی خۆمان سەبارەت بە کچ وکوڕ ودایک وباب وخەسوو و خەزوور بزانین. خواوێنەی ئەم جۆرە بابانە لەکۆمەڵ نەبڕێ.

**تاران: خوشکە: ن ـ لاجانی**

هاوکاری ئێوە بۆ سروە جێگەی شانازییە. هەرچی لە دەستتان دێ دریغی مەکەن ئێمە ئێستا باسی بنەماڵ و خاو خێزانمان لە سروەدا، هەیە. دەتوانی بابەتی سەر بەئەم باسانە بۆ ئێمە بنێری ئەگەر رۆژێک "پاشکۆی تایبەتی ژنان" لە سروەدا بڵاو بووە بەشێوەیەکی هەراوتر دەتوانن یارمەتیمان بدەن.

**مەریوان: کاک نەبی ئەسەدی**

نامە پڕهەست وجوانەکەت گەیشت لەهەستی جوانت رێز دەگرین لەهەرپێشنیارەکەتکە مانا کردنەوە و لێکدانەوەی واژەی کوردییە پێوستە بە ئاگاداریت بگەیەنین کە ئێمە شگەڵاڵەی ئەوکارەمان بەدەستەوە وئەگەر بتوانین وکارو باری دیکە مەجالمان بدا بەڕێوەی بەرین بە هیوای خوای مەزن.

**سەقز: حەمید دادار**

باسێکی جوانت هەڵبژاردووە و پێویستی بەوردبوونەوە ولێکدانەوە ـ یەکی هەموولایەنە هەیە. ئەگەر بتوانی ئەم باسە

به‌جوانی شی بکه‌یه‌وه ئێمه‌ش بۆله‌چاپدانی هه‌وڵی خۆمان ده‌ده‌ین .

**بانه :** عومه‌ر

پێشنیاره‌کانت زۆرجوانن که‌لکیان لێ وه‌رده‌گرین و خوا یاربێ له ژماره‌کانی داهاتوودا ئه‌م جۆره باسانه‌ش چاپ ده‌که‌ین .

**شنۆ :** له‌تیف خالیدی

تا زه‌مانێک کوردی و فارسی وه‌ک یه‌ک ده‌نووسران نووسینی خه‌تی نه‌سته‌علیق وشکسته‌وشتی وا له‌کوردیشدا باو بوو. یانی زۆر که‌س شیعری کوردی یان به‌م شێوه ده‌نووسی.به‌ڵام پاش ئه‌وه‌ی کوردی ئه‌لف وبێی تایبه‌تی خۆی دارشت شێوه‌ی خه‌تتاتی فارسی وعه‌ره‌بیش وه‌لانرا چونکوو له‌گه‌ڵ ئه‌لف و بێی کوردی رێک ناکه‌وێ .

**سه‌قز :** هادی خورسه‌ندی

براگیان: ئاش به‌ نۆره‌یه . به‌ڕای جه‌نابت راوه تاژی بێ به‌رهه‌مه ده‌نا وانیه و تکات لێ ده‌که‌ین جارێکی دیکه‌ش به وردی بیخوێننه‌وه .مه‌سه‌له‌ی ئه‌رباب ورده ورده به‌ره‌و له‌نێو چوونه و زۆریشی باس له‌سه‌ر کراوه

ژن به‌ژنه درێژه‌ی هه‌یه وبه‌هیوای خواله‌ژماره‌کانی داهاتوودا ده‌یبینی.

نامه و دیاری ئه‌م ئازیزانه‌شمان به‌ده‌ست گه‌یشتووه . پڕ به‌دڵ سپاسیان ده‌که‌ین و هیواداریین هه‌روا به هاوکاری خۆیان درێژه بده‌ن .

**عێراق:**تاهیر سووره مێرگی

**سنه :** توفیق مه‌حموودی

**ورمێ :**ئه‌میر حوسێنی

**مه‌هاباد :**س . به‌ختیاری

**خانێ :** سه‌لاح سه‌ید محه‌مه‌دی

**عێراق:** س . ع

**مه‌هاباد :** تاهیر قادر زاده

**خانێ:**محه‌مه‌د ئه‌مین عه‌بدوڵلا زاده

**نه‌غه‌ده :**ئه‌بووبه‌کر ئیسماعیل پاک .

**مه‌هاباد :** ناسری بابامیری

**مه‌هاباد :** ئیسماعیل قاسمی

**بۆکان :** مسته‌فا ئیسماعیل‌پور

**سقز :**ئه‌حمه‌د ئه‌حمه‌دیان

**شنۆ :** سه‌میع یوسفی

**بۆکان :**خالید ئه‌حمه‌دی

**بۆکان :** ره‌سووڵ خدری

**گلێنان :** هه‌مزه خودا داوه عه‌لی مسته‌فا

**بۆکان :** نادری مسته‌فازاده

**سه‌قز :** عه‌بدولعه‌زیز زه‌مبیلی

**سه‌ردشت :** ج، م، شه‌مزاو

**بانه :**جه‌ماڵ عێزه‌ت په‌نا

**نه‌غده :**سه‌ید نه‌جمه‌دین عه‌بدوڵلا پوور

**سه‌قز :** سه‌عد هیجانی

**ره‌حیمخان:** خالیدئه‌حمه‌دی

**پاوه :** ئه‌نوه‌ر زوهرابی

**مه‌هاباد :**سه‌لاح عه‌بدوڵلا زاده

**مه‌هاباد :**مامۆستا فیدایی

**بۆکان :** ئه‌حمه‌د حاجی ئیسماعیل زاده

**سه‌قز :**حه‌سه‌ن زه‌بیحی

**مه‌هاباد :** سوله‌یمان مه‌جیدی

**مه‌ریوان :**که‌ریم مه‌ریوانی وهاورێیانی

**شنو :**جه‌لال راهی

**بوکان:** سه‌ید .م .قوره‌یشی

**شنو :**ئه‌حمه‌د ره‌حمانی

**پیرانشار :** ئه‌بووبه‌کر ئیسماعیل پوور

**بوکان:**جه‌لال عه‌شایری

**سه‌قز :**محه‌مه‌د خاره‌زمی

**مه‌هاباد :**هه‌ژار عیبادی

**بوکان:**جه‌عفه‌ر فه‌قێ میری

**سیلو :**سه‌لمان ئیحیایی

**بیجار :** ره‌مه‌زان خان ئه‌حمه‌دی

**ته‌ورێز :** سارا حاجی

**سه‌قز :** ئه‌دیبه ئازاد

**نه‌غه‌ده :** ره‌حیم به‌رقی

**سه‌قز :** فه‌ره‌ج سه‌عدی

**بوکان:** نوسره‌ت سه‌لیمی

**شنو :** مسته‌فا ره‌سوولی

**سه‌رده‌شت :** محه‌مه‌دئه‌مین مه‌ولایی

**دانمارک :**فه‌رهاد پیرباڵ

**مه‌هاباد :** ئیسماعیل شه‌ریفی

**پیرانشار :** مته‌لیب عه‌بدۆ

**مه‌هاباد :** سه‌یدعه‌لی هادی

**شه‌ختان :** باپیر کاده‌روێشی

**شنو :** غه‌فوور سه‌لیمی

**نه‌غه‌ده :** کاکه لاوپشده‌ری

**سنه :** جه‌لال مه‌له‌کشا

**بوکان :** سه‌عید که‌ریمی

# بەهاری زەرد

## ج. ئاشتی

وەرە هاوڕێ ، وەرە سەیری دەردم
لەسەر ئەم دەردە ، بەهاری زەردم
لێک دەکەن رەنگی بەهار و هی من
لە پەژارە و غەمی مەرگی "هێمن"
وەرە بڕوانە " مەهاباد"ی مە
کە جوانی ی و گەشی ئەو شادی مە
نایە لێی دەنگێ لە دووی بێ ئۆخەی
بێ لە هاوار و شەپۆڕ و واوەی
هەرچی بێ گەردە ملی بەکوێنە
هەرچی کولمە بە رنینێ خوێنە
چەشنی گۆڕخانێ بەسامن جێژوان
کیژ و لاو لەو کەسەرە وا شێوان
هیچی یادی نیە ئەوڕۆ پەیمان
دەنگی ئەم ناڵە دەچێ بۆ ئاسمان
دەگ نەبێ ژوانێ بە رەشپۆشی بێ
دەردی دڵ کردنێ بێ خۆشی بێ
سەر نەوی کردنە بەرەو رووی قوبلە
خەڵکی " شوانان" و "گومرگ" و "قوبلە"
"رزگیان"، " ئەرمەنیان" و "سێ ئاش"
"تەپی تابانی"، "خڕێ" و "سەربەرداش"
پاکی هەرد دەکوتێ بەنێو چاوانی
دەستبە ئەژنۆن هەموو تۆ نازانی
نوێژی ئێوارەیە ، چۆک دادانە ؟
یا نە کڕنووشی بەرەو قەبرانە ؟
شادی خەمبار " بداق سوڵتان"ە
فەخرە بۆی هاتنی ئەم جیرانە
کەچی دەڕوانێ وەکوو جارانە
ئەمەگی خەڵکی نیشانەی مانە

هەرچی فرمێسکی گەشە دەی رێژن
نایدەنە خاک و لە دڵ دەی نێژن
دڵە هەرچەندە برینت سەختە
گیان لە لەش دەربچێ لێرە وەختە
سەرێ با روو لە دەرەی " لاچین" کەین
دوور لە چاوان بگرین سەر شین کەین
لە "موغارێ" و قەد و لووتکەو داوێن
بە هەنیسکی لە کوڵی بەرد تاوێن
زێدی تاساو و پەشێو راژێنین
" سارم"ی جەرگ بڕاو لاوێنین
هەڵگەرێین بۆ سەرو "شیلان ئاوێ"
چاوێ لەو ناوە بگێڕین تاوێ
ئاخۆ هەر دار و کەژی ئەو نێوە
رەمزی سەربەرزیی و مەزنی خێوە ؟!
ماوە شەوگوردی کوڕی گونداوگوند ؟
ماوە ئەو بیری فڕی دونداودوند ؟
ماوە گوێ گرتنی تووڕەی بلوێر
کاتی خەو ، لەو کەژ وشاخی زەنوێر ؟
ئێستەکەش خۆشە شەوی بێ دەنگی ؟
دێتە گوێ شین و گڕوی یەکڕەنگی ؟
دەردی دڵ کردنی لەگەڵ ئەستێران
دادەمرکێنێ کوڵ و کۆی مێران ؟
کانی دڵ روون کەرەوەی "پیرێژن"
سەردە ئێستەش بە هەناسەی "هێمن"؟
شەنگە بێری لە شوان دەڕوانێ
بێتەوە و کوێنی ملی پێ دانێ ؟
" دێم ودێم" دێتە گوێی "خانم"ی دێ
گیان بکێشێتە پەنا پەردەی گوێ ؟
شایی هەر ماوە " هەژار" هەلبەزێ ؟
دویەکی بێتە دەس و جەرگی تەزێ ؟
یا نە لێی نایە ج جووکە و نووکە؟
ماتە بۆو بولبولە سەربێ تووکە؟
دڵ کە جوێ نابێ لە قەبران تاوێ
دەفڕی تەیری خەیاڵم تاوێ
" کانی پیرێژن"ی " شیلان ئاوێ"
ئاوی سەرچاوەیی ئەمڕۆ ناوێ

هێندە گریاوە بۆ یاری گیانی
**پێلی دەریایە کە لاوی کانی**
ئاشەکەی کۆن و کەلاوەی سەردێ
ئاوەدان بۆتەوە بۆ شینی نوێ
بەردی بەرداشی " قەلات"ە و "هەلگورد"
سوێسن و لالە دەهارێ ورد ، ورد
لە بنار گردی " هەوارە بەردە"
کەو سیا سووتە و سووت لەو دەردە
هیند بە دەنگ بەرزیی لەبەرزاییدێ
گوتی : جێی بەرزی دەوێ شینی دەوێ
هەلگەرا بۆ سەری کێوی " چەکوچی "
شینی شاشین بێ بە دەنگی چەکوچی
لە " هەواری سەری کرماویلێ "
شوێنی هەلدانی کولّی دلّ کەیلێ
شەنگەبێری بە هەنیسکان دەگرێ
شوان نەما تا وەکوو فرمێسک بسرێ
ئەو " هەمین"ی کە بەدانەی خالێ
" هێمن"ی بردە " هەورای خالێ"
پێی فرێ داوە شەدە و دەسمالێ
دەردی بینینی هەواری خالێ؟
" کێوەرەش" سەر بەهەش و رەشپۆشە
ژینی کەژ دوور لە هەلۆ ناخۆشە
دەردی ئەو ناوە بەتینی توانە
وەرەوە خواری خەیال لەو بانە
جاڕی " بۆندرغ"ە بە باغی بێ رەنگ
وەکوو دایکێکی هەتیوبار بێ دەنگ
کاکی جووتێری بەری " سەردەشتان "
دوژمنی کۆنی وچان و وەستان
دەستی قەلشیوی لە پاشبارە شل
بوورە دەدوێنێ دژ و لارەمل :
" کێ یە ئەمجارە بە ئەوکی زێڕین
بۆم بلّێ شیعری کە ئارەق بێ وتین ؟
" پێم بلێ چۆن لە مەچەک رابێنم؟
" چۆن لە کار کاوی دڵ و ژن بێنم؟
هەرچی شینکەی کە لە دەشتی شینن
هەموو سەرشین و خەریکی شینن
شینی شینگێڕی گولّی پەڕ، پەڕ بوو
کە لە شینی گولّی گەش پەڕ، پەڕ بوو
وا خەیال لێرەوە دەڕوا لە سوێی
نالّەیی " سروە " کە : "با بەلەکوێی؟
هەوری بۆری سەری "گۆلی ورمێ"
بە کزەی سروە قژی خۆی دەڕنێ
هەور و ئاو هەردوو لەباوەشێیەک دان
قەت نەبوو هێندە نەوی بێ ئاسمان
بەسیەتی بیری دلّی شێواوم
وەرەوە لای دلّی لێقەوماوم
شینە دلّ ، سووری ئەتۆ، زەردم من
با بدەین دەورە لە گلّکوی هێمن"
نالّەمان گەرمی بکا دیلانێ
نەک بلّێ : "رەشبەلّەکی من کوانێ؟
چاوە هەلچۆڕە بە ئاهەنگ بگرێ
دلّە سەرچۆپی بە دلّ بۆ بگرێ
تۆم کە ناسی بەخەیالّم لەو بوو
پێ گەیی بیری منالّم لەو بوو
هەستی بێ خەوشی ئەوینم لەو بوو
بیری رازێنەری ژینم لەو بوو
بیری : سووتان وەکوو خۆری سەرکەل
وەکوو مۆم روون کەرەوەی بەزمی گەل
بیری : شەوگارە کە دیلی چوونە
بیری : هیوام بێ کە " ئاسۆ روونە"
شوێنی ئەم پەندە لە دلّ هەرمانە :
لە ئەوین ڕایە کە دنیا جوانە
دلّە بۆ یەکتر ئەمە ناسیاوین
هەر خەیالّە کە فریوی داوین
ئەگینا کوا وزە بۆ ئینسانێک
لێرە ئەورۆ هەیە بۆ دیلانێک
شەرتە تۆ یادی بکەی هەر ساتێ
بۆ گرین هەوری بەهار نەمگاتێ
تاکوو ئەو میسرەعە بۆم بێتە ژوان
"تەک و تەنهام و عەزیزانم کوان؟"
دەستلەمل بووکی ئەوین ئالێنم
لە گەلی گەرم و بەهەست نالّێنم.
بە مۆژە و جەوهەری سووری ئەسرین
هەر بنووسم شەوو رۆژ شیعری شین

لە کوردستاندا زۆر جێگا و شوێن هەن کە دەکرێ وتاری عیلمی وزانستی و مێژوویی و ئابووری لەسەر بنووسرێ .بەڵام بەداخەوە ئێستا زۆر شوێن و مەڵبەند هەن کە نەناسراون و زۆر بە کەلک وسوودن. پێویستە سروەی خۆشەویست ئەو شوێن و جێگا بەنرخانەی کوردستان کە لەباری ئابووری ومێژوویی و عیلمی جێی سەرنجن ، نەهێڵێ لەبەرچاو ون بن و وتاریان لە سەر بڵاوبکاتەوە .

چونکە هەریەک لەم شوێنانە تایبەتی یەکیان هەیە . یەکێک لەو شوێنانەلەناوچەی شاروێرانی مەهاباد هەڵکەوتووە ، ناوی "شامە" . پێویستە بزانین شام چیە وچ تایبەتی یەکی هەیە . شام هەزاران هێکتارزەوی بێکارە وکەوتۆتە خوارووی شاروێرانی مەهاباد. لە راستیدا شام بەشێک لە پانایی دەریاچەی ورمێ یە وبەهۆی ئەوە کەئاوی کەم لێرادەوەستێ بۆتە لەوەڕ گەیەکی یەکجار بڵیند و باش و چەندین جۆرە گیای تێدا شین بووە کە بەشی هەرەزۆری ئەم گیایانە بریتین لەپووش،قامیش جەگەن وپەڵەخ .

گوندەکانی خورخورە،بەفرەوان گردی یاقووت ،داشخانە ،مەمێند وگردەقیت لەدەورەی ئەم شامەدا هەڵکەوتوون .هەربۆیەش خەڵکی ئەو گوندانە زۆرتری کەلک لێ وەردەگرن . لە راستیدا هەموو کەس دەتوانێ لە مەرتەعی "شام" ئیستیفادە بکا .

لە دەورەی ئەم شامەدا سێ کێو هەڵکەوتوون ، یەکێک لەو کێوانە گەرووسی پێدەڵێن کە کەوتۆتە خوارووی خورخورە و ئەشکەوتێکی بەناوبانگی تێدا بەناوی ئەشکەوتی فەتاح .

وەک دەگێڕنەوە لەقەدیمدا ئاغا فەتاح یەکێک لە مەزنەکانی دێبوکری بوو .بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی خۆی لەو ئەشکەوتەدا سەنگەری گرتووەوشەڕی لەگەڵ کردوون .و چەند رۆژ وشەو بەداروەستەوە تێدا بووە تاکوو دوژمنەکانی تێک شکاندووە . ئەو ئەشکەوتە لەرەوەزێکی زۆربڵێندوسەختدا هەڵکەوتووە وزارکی بەردێکی یەکجار زۆر گەورەی لێیە کە ناهێڵێ تیری دوژمن بیگرێتەوە

کێوی "گەرووپانکە" لە خوارووی گردی "یاقووت" وکێوی "بداغ" لە خوارووی داشخانەیە کە لە زەمانی ڕێژیمی رابردوو ئیدارەی شکاربانی لەسەر بوو . ئێستاش ساختمانی ئەوئیدارەیە لەوێ ماوە بەڵام خەڵک هەموویان خەرا کردووە .پاش ئاوی سەدی مەهابادیش بە ناوچەی شاروێراندا دەچێتە نێو شام بۆیە هەمیشە هەتا گوێزینگان ئاوی تێدا وبۆتە جێگای ژیانی هەزاران جۆر باڵندەی جوان و ئێستا ئەو شوێنە لە ناوچەی مەهاباد باشترین جێگایە بۆ راو .

پووش ،جۆرە گیایەکی نەرمە کە لە هەوەڵی بەهاردا شین دەبێ ولە هاویندا وشک دەبێ ، رەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ پاش رەنگ زەردبوون دەچن بەداس یا مەڵەغان دەیدروون وباقە ،باقەی دەکەن وبافەکان بە بەندەک دەبەستن بەندەک بووشێکی تەڕو خاوە کە بە دەستی بایدەدەن تاکوو وەک گوریس یا پەتکی لێدێ . پاشان باقەپووشی پێدەبەستن .و ئەم پووشە بۆ داپۆشینی خانووبەرە ئیستیفادەی لێدەکرێ.زۆرجاران سەری قەڵاغ ودەوەڵانی پێدا دەپۆشن و بۆپێشگرتنی ئاوی بەندو جۆگەکەلکی لێ وەردە ـ گیرێ و لە باقەپووش سەرەکولانگرەش دروست دەکرێ کە

کولانەی پێدەگرن وقەرەساوی لێ
دروست دەکەن .

قەرەساو بریتییە لە
باقەپووشی درێژ و ئەستوور کە
وەکووبەندەک بادرابێ و پاشان
چەند باقەپووشی درێژوئەستوور
پێکەوە دەبەستن وبۆپەڕینەوەی
سەر ئاو کەلکی لێ وەردەگرن ،
چونکە پووش لە سەر ئاسووکە و
قوم نابێ .

قامیش گیایەکی سەوزوجوانە
کە لە بەهاردا شین دەبێ و لە
پایزدا زەرد هەڵدەگەڕێ.قامیش
وەکوو وێنجە هەموو ساڵێ شین
دەبێتەوە و بۆ داپۆشینی
خانووبەرە و دروستکردنی
(بۆری)کەلکی لێ وەردەگیرێ .

"بۆری" حەسیرێکی گەورەیە
کە لە پاش دارەرێی وەتاغ بە
سەر دارەکاندادەدرێ. زوربەی
خانووبەرەی دێهات بە پووش و
قامێش دادەپۆشن .ئێستا باقەی
قامیش بە ١٠٠ تمەن وەگیر
ناکەوێ .قامیش زۆر خۆڕاگرە .
بە ئارەقەی تەویلەوهۆڵ نارزێ
و لەنێو ناچێ .

جەگەن گیایەکی نەرمە بەلام
لە پووش ئەستوورترەوبلێندترە
کە بۆ دروستکردنی حەسیر
کەلکی لێ وەردەگرن.بۆ دروست
کردنی حەسیر ،جەگەن دەقەڵشێنن
نێوەکەی دەردێنن پاشان چوار
سینگان دەکوتن و١٢یان ١٤
بەندەکیان تێدەکەن ودارێک لەو
سەر ئەوسەری بەندەکەکان
دەکەن ،کە١٢ تاکوو١٤ کونی
تێدایە پاشان بەراست و چەپ

جەگەنی تێوە دەدەن و بە دارە
کونەکە (رفەشی) پێدەلێن
دەیکوتن وپالی پێوێکدەدەن
لەبەر هەڵوەشان سەری
بەندەکەکان لێک دەبەستن .

پەڵەخ زۆر وەپووش دەچێ
بۆسەر ئاخنینی گێشە وگیاو...
کەلکی لێ وەردەگیرێ .

قەدیمی دەگێڕنەوە ئەو
زەمانێ کە بە کەڵ ؟ئارەبە
دەچوونە ئەم"شامە" بەرەوە
بەرازیان دەدی. بەلام چون
گۆشتی بەراز بە شەرع حەرامە
ئیلاقەیان نەدەکردن مەگەر
سەیر چووبانە راوەبەراز .ئەمما
کاتێک ئەرتەشی شووڕەوی ،
ئازەربایجانی داگیرکردوهاتنە
کوردستان قازاخەکانی شووڕەوی
بە تفەنگ دەگیانیان بەربوون
هەر مۆڵەتیان پێ نەدەدان
لە کوشتنیان غافڵ نەبوون.لەو
وەختەوە بەرازی کەم لێ ماوە
بەلام پڕە لە گورگ و رێوی
لە خواردنی باڵندە وئاژەڵ
لەم شامەدا دەژین خافڵ نین .

راوچی لەبەر سەرما و تەڕ
بوون پاڵتۆ ولیباسی گەرمیان
پێیە . جاری واشئەنایلۆن
لەگەڵ خۆ دەبەن ولە کاتی
بەفروباراندا بنەسەر خۆیدا
هەڵدەکێشن .

سیپە : بریتییە لەحاشارگە
یەککە راوچی خۆی تێدا حاشار
دەدا .سیپە دەبێ لەسەر رێگەی
هاتووچۆی باڵنداندا بێ .
سیپە لە بەفر و تەختەسەهۆڵ
و یا لە پووش و قامیش دروست

دەکرێ . سیپە تەنیا جێی یەک
یا دوو راوچی دەبێ.باڵندەکانی
و شام کە راوچی راویان دەکەن
بریتین لەمانە :

سی ،قوو ،قەرەناز ، سوورە
و قورینگ ،هەڵەتانج ، سۆنەوبۆرە
... جۆرەی لووت پان ،سوورەقانگ .

بەگوتەی راوچییان باڵندە
زۆرتر لە شەودا دەگەڕێن
راوکردنیان بەشەو خۆشترە
دەڵێن حۆرەمراوی یەک هەیەلە
هەموو باڵندەکان وشیارترە و
زۆرکەم خۆ لەسیپە دەدا . بە
بۆ پێچەوانە سوورەقانگ لە سیپە
ناپرنگێتەوە .

خووخدەی باڵندەکان :

سوورەقانگ وهەڵەتانج هیچ
وەخت لەنێو شامدا کورک نابن.
ک[illegible] کورک بوون دەچنە دەرەوەی
و شام. بەلام کە جووچکەیان
هەڵێنا وەکوو پشیلە
جووچکەکانیان بۆنێو شام
دێننەوە. سوورەقورینگ لە
خوارووی هەموو باڵندەکاندا
کورک دەبن تاکوو ئینسان
نەتوانێ بۆ لایان بچێ.باڵندەی
واش هەن لە قەراغی شامدا
کورک دەبن وەکوو :

مراوی ، رەش بەشە ،زیق زیقاوە
ئێستا بەهۆی بەسەررانەگەیشتن
ئیدارەی شکاربانی وراوکردنی
بێ رەویەی راوچییان ، ژیانی
باڵندەکان لەوشامەدا کەوتۆتە
مەترسی . ساڵێ هەزاران جووجکەو
هێلکەی ئەو باڵندانە بەدەست
ئینسانی ،ئینسان لەنێو دەچن

# کوڵی دڵ

## سەیدتاهیرهاشمی

بـەهـا رهـا ت سـروه دەنگـی دڵـتـەزێـنی بـلـبلێ هێنا
لـەنـێو بـا خـا ن نـەسـیمـی بەربەیا ن بێنی گوڵیهێنا
لـەسـەرکێوا ن دوا یی کـا ژولـێـژی بـەوری زسـتا نی
بەنـرکـەی هـەورەوە دیسـا ن پـڵنگـی پڵێلـی هـێنا
بـەجێیە مـا ت وحـەیرا نـی تفا ق وهەیت وهـووتی بم
کەوا هـەیتێ بەهـێیدا وهـەیتـی سێوی سەرچلێ هێنا
شـەتا و هـەرچەندەهـۆنەی دیدەیـی عـا شق وەبیردێنێ
قەرا خی چا وەکەی چا وی وەنەوشەو سنبلی هێنا
مـەگەر پا ییز وهـا وینـە عـەزیزا ن وا بـەئـەم رەنگـە
بنێشت ومـا زوو وقەزوا ن وشـۆکـە وگـزگـڵـی هـێنـا
هـەوا ی ئەم دەشت وبا نـە هێندەحا ڵەت پەروەرەوئا زیز
لـەسەرکێو شێری شەرزە ومـێرغـوزا ر ئا سکی سلـی هێنا
بـەتا وی وەشت وسەوزەی دەشت وگرمەی کێووهـا ژەی چەم
کەوی گەردن بە خا ڵ سـوێسکی قەشەنگ پۆڕی شلی هـێنا
هەمووچـەشنە شتێکـی جـوا نی هـێنا نەوبەها ر ئەمما
لەدەردی مەرگی هێمـن سەد ئەسـەف دا خـی دڵـی هـێنا
لەبەرئـەم وشکە سا ڵـە تـا هـیرا سەرچـا وەی تەبعـم
نـەمـا ئا وی ،ئـەمـەش یـەک دا خـما بوو دڵ کلێ هێنا

# تەزبێح

## " مەولەوی "

جیلوەی جـەلای جام دڵـەی پڕ جەگەرد
فەرمـا ت پەی تـەزبێح ها رەوا نەمکەرد
پەرێ تـۆ خـا سە ن هەرشا م تا سـەحـەر
هەر ژما رەی وەسڵ با ڵای دڵبـەر بـەر
نـەک چو ن من وزوو وەهوونا و وەسـتە
خەم سیوا ک ،نما ی مەینەتا ن بـەستـە
نیشتەی گۆشەی تا ر نما زخا نـەی دەرد
روو نەپا ی میحرا ب هەنا سا ن سـەرد
وەی وزوو ونـمـا وەی سـیـوا کـەوە
جەی گۆشەی میحـرا ومزگـی پا کـەوە
دا نەی مەرجا نـی هەرس مـەهـجـووری
هونیا ی تا س کرژ رشتـەکـەی دووری
پەی ژما رەی زکر کزەی ئێش ونێـش
کا فیە ن دیدەم تـەزبێحـم پەی چێش

ئەی وتەنیام وعەزیزانم کوان
بۆنی گۆڕخانەی لێدێ جێژوان.

## کوردی

دە روو ن زامدا رو دڵ غەمگینە بێ‌تۆ
سەرم گێجە تەنم بێ تینە بێ تۆ
خەوم بێ هۆشیە ، بەرگم پەلاّ سە
خۆراکم خوێنە ، شادیم شینە بێ تۆ
جێگەم سەحرایە ، وەحشی یاروها ودەم
دڕک فەڕش وکوچک بالێنە بێ تۆ
سەرم سەمتوورە سینەم چەنگ و دڵ دەف
خەفەت تا رو مەقام نالێنە بێ تۆ
ئەوا من بووم بەشاو سوڵتا نەووالی
سەریری عیززەتم کەی ژینە بێ تۆ
لە هاوسایا نلە تاونالێنی «کوردی»
دوعای مەرگم لەوێش ئامینە بێ تۆ

## "حەقیقی"

کەو وکوڕکوڕ لەسەر دوندی چیای شین
دەنالێنن لە شیفی مەرگی هێمن
گوڵی باغی ئەدەب ژاکا لە ناکاو
لەبەر ئەو زەردە رەنگم وەک بەهێ من
بەهارە وحەقیقەتی بولبول بنالێ
دەڵێ: لەوشیعری پاراوم دەوێ من
لەنێو باغان دەڵێن شەونم دەبارێ
کەچی فرمێسکە ، دیتم دوێ شەوێ من
وەهای دادا هەور بارانی ئەسرین
بەراووشینە هەرچی وشکە دێمەن
بنەو بارگەی تەمەنمان گەییە ئاسۆ
لەوێ ئەو تێپەڕی، ماوم بەجێ من
لەشوێن ئامانجی دڵ نەسرەوت و رۆیی
لەشینی ئەو دڵم چۆن بسرەوێ من
لەپاش تۆ شاعیری بەرزو بەڕێزم
قەت ئاواتی دڵم نایێتە جێ من
لەدووریت تازە دڵخۆش بم مەحاڵە
بەنەغمەی بولبول وقاسپەی کەوێ من
بە بێ تۆجەرگی من سووتاوە "هێمن"
ئەمن ئاوام ئەتۆ چۆنی بەبێ من ؟!
رەفیقان دڵ بریندارە "حەقیقی"
دەوای ئەو زامە داوا کەم لەکێ من ؟.

## بدەستیات
## یادی هێمن «بیەقادردە»

بە یادی هێمن ئەوڕۆ سروەیەک دێ لێی گەڕێن با بێ
نەسیم بۆنی بەهەشتی پێوەیە. ئەمرۆ لە هەر لا بێ
شەووڕۆژ رادەبوورێ و دڵ خەمی وی قەت لەبیر ناچێ
دڵم دەتلێتەوە بەو دەردەوە زۆر ئەستەمە رابێ
هەتا کۆنتر دەبێ یادوارەکەی زۆرتر دەبێ دەردم
برینی کۆنە ناسۆری بە ئێشەکەی بلێی چابێ
خەمی ئەو زەڕڕەزەڕڕەی جیسم وجانی گرتووم ئێستا
خەمی عالەم،چ تۆ ضیری هەیەبۆ من نەیە نابێ
لەئاسۆگی هومێد ئەستێرەیەک ئاوا بووە ئەوڕۆ
ئەگەر رۆژێک لەوێ هەڵ بێ بەزەحمەت شۆقی ئاوابێ
لە دونیای ئێمەدا مانگێک هەڵات و رۆیی ئاوا بوو
بە من چی گەر تەواوی ئاسمان عەقدی سوڕەیابێ
ئەگەرچی خونچە زۆر پشکوتووە لەم باغ وگوڵزارە
لە گوڵزاری ئەدەب بەم شێوەیە گوڵ تازە شین نابێ
دڵی تاریکی من روونە بە یارانی ئەدەب پەروەر
دەڵێی رێبازەکەی دەگرینە بەرچاو یاخودا وابێ
خودایا لێی ببوورە رەنجی زۆر دیوە لە دونیادا
ئەویش با موستەحەققی رەحمەتی باریتەعالا بێ
ئەویش ئەولادی تۆیە یا ( رسول الله ) لەمەحشەردا
کەیاران لێت وەخڕبوون خۆت بفەرموو (هێمن)یش بابێ
خەمی دنیای لەبیر وێرانەکەی دڵ بردەوە سەیید
خەمی ( هێمن ) بەخێر هات بۆدڵی من ماڵی ئاوابێ

مامۆستاگیان :

کارێ کەخەم ودەردی فیراقت بەمنی کرد
سەرما بەهەتیو بابەدەواری شڕی ناکا

«سروە»

# گوزارشت :

# زانستگەی ئازادی ئیسلامی مەهاباد

لەماوەیەک لەمەو بەرەوە دەنگ وباسی بنیات نانی دانشگای ئازادی ئیسلامی مەهاباد لەهەمووشوێنێکدا بڵاو بۆتەوە. ئەم هەواڵە بەتایبەتی بۆ ناوەندی بڵاو، کردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی (ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی) زۆر گرینگ بوو. چونکە بۆ ناوەندێکی فەرهەنگی کورد کرانەوەی ناوەندێکی فەرهەنگی زانستی وەک دانیشگایەک کە قەرارە. زبان وئەدەبی کوردیشی تێدا بخوێندرێ دەتوانێ هەواڵێکی گرینگ وچارەسازبێ. هەرلەبەر ئەو هۆیەش ئێمە نوێنەری خۆمان ناردە مەهاباد تا لەگەڵ کاربەدەستان وبەرپرسانی ئەم کارەگرینگە، کۆبێتەوەوسەروبنی هەواڵەکەمان بۆ روون کاتەوە.

بەپێی گوزارشتی نوێنەری ئێمە هەمووکاربەدەستان وبەرپرسانی شارستانی مەهاباد وهەروەها زوربەی دانیشتوانی شار ئاگادارن کە مەڵبەندی ئێمە نیازوپێداویستی یەکی زۆری بەزانست وپێشکەوتن و جووڵانەوەی فەرهەنگی هەیە. ئەوەش روون بۆتەوە کە ئەم ناوچەیە پڕەلەهاوشاری و هاووڵاتی بەئیستعداد وبە شۆق وزۆق. ناوچەکەشمان لە باری کشت وکاڵ وئاوەدانی وئاژەڵداری وباغداری یەوە یەکێکە لەناوچە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئێران و ئیستیعدادی پێشکەوتن و دەوڵەمەندی زۆرە لەباری فەرهەنگی‌وزانستیشەوە مەڵبەندی موکریان لەقەدیمەوەناوەندی خوێندن و زانست بووەوەو جەماوەری خەڵک عەلاقەیەکی زۆریان بەخوێندن وپێشکەوتن هەبووە.

ئەم هۆیانە لەسەریەک، کاربەدەستان وبەرپرسان و خاوەنڕایانی مەهابادی هان داوە کەبۆپێک هێنانی بارودۆخی بنیاتنانی دانشگای مەهاباد دەست بەکاربن.

یەکەم کۆبوونەوە لەم پێوەندی یەدا رۆژی ۶۵/۴/۱ لە مەهاباد پێک هات لەم کۆبوونەوەیەدا پاش باس و لێکۆڵینەوە وراوێژی زۆر، کۆری باوەر پێکراوانی دانشگاە(هیئت امنای دانشگاه) هەڵبژێردرا کە ئەندامەکانی بریتین لەئیمام جومعەی شار نوێنەری مەهابادلەمەجلیسی شورای ئیسلامیدا، فەرماندار سەرۆکی ئیدارەی بارهێنان و فێرکردن، یەکێک لە دەبیرە قەدیمی یەکانی شار، سەرۆکی شوورای ئەسناف و نوێنەری دوکتۆرەکان،

پاش ئەو کۆبوونەوە. بەرپرسی کۆمیتەی زانستی دیاری کرا تا هەل ومەرج و بارودۆخی زانستی مەهاباد وئەزموونی شارەکانی دیکە کە خاوەنی دانیشگای ئازادن، بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەو گوزارشتی کاری خۆی بڵاو بکاتەوە. لە ئەنجامی ئەو کارەدا بڕیاردرا کە. ئەو رشتانەی ژێرەوە لە دانیشگای ئازادی ئیسلامیدا بخوێندرێن.

٢- رستەی ئاژەڵداری

٣- رشتەی ئەدەبیاتی فارسی و کوردی

٤- رشتەی فەننی وئاوەدانی ( عمران )

٥- رشتەی ( الهیات و، معارف اسلامی )

هەروەها دانانی رشتەی پزشکی لەژێر لێکۆڵینەوەو راوێژدایە. یارمەتی خەڵک: بەپێی گوزارشتی بەرپرسانی ئەم کارە فەرهەنگیوزانستییە خەڵکی شاری مەهابادو بەمالیک ومووچەخۆر وئەسناف وقوتابی ووەرزێر وکارگەرەوە پێشوازییەکی شایانیان کردەوە و تائێستا پووڵێکی زۆریان بۆ خەرج وموخاریجی دانانی دانیشگا داوە. مامۆستایانی ئایینی ناوچەش بێجگە لە یارمەتی ماڵی زۆرتێدەکۆشن خەڵکی گوندو شاری ناوچە بۆیارمەتی هان بدەن.

لەلایەن کاربەدەستانی دەولەتیشەوە لەم کارە پێشوازی کراوە. **جەنابی حجت السلام هاشمی رەفسنجانی و سەرۆک وەزیری کۆماری ئیسلامیش یارمەتی ئەم کارە - یان داوە وبەڵێنی یارمەتی داهاتووشیان داوە.**

وەک هەواڵنێری ئێمە رای گەیاندووە. بۆ بەرێوە بردنیکار وباری ئەمدانشگایە لەباریئابووری یەوەبێجگە لەوەرگرتنی( ساڵانە- شهریە ) قەرارە هێندێک سەرچاوەی باوەرپێکراوی ماڵیوئابووری دیکەش وەک کردنەوەی نەخۆش - خانەو ئاژەڵداری و.... دابیر کرێ وداهاتەکەی بۆ دانیشگا تەرخان بکەن.

هیواداریـن هەر بەوزوانە هەواڵی کرانەوەی ئەودانیشگا - یەمان پێ بگاو ئێمەش ئامادەیی خۆمان بۆهەموو خزمەتێکی کەلەدەستمان بێ. دەردەبڕین.

## « خاڵەمین »

شاعیری میللی ، هێمنی ، کاکی
لاڵ بم ئەورۆکە دیلی ژێرخاکی
تۆ لەشت مردووە گیانت هەر بەرزە
رێز لەتۆنان لەسەر هەمان فەرزە
تۆ چرایەکی پڕ لە پڕشنگی
دایکی نیشتمانە دەکوتێ بۆ سنگی
شێرە رۆڵێکی کورد و کوردستان
ئاخ کە مەرگت بەهاری کرد زستان

حاجی و پیرەمێرد و هەرچی نەمان
راستی تۆ هەبووی لەجێی هەموان
ئەدەبی کوردی هەر لە تۆ جوان بوو
شیعری تۆ رابەری هەمووومان بوو
خزمەتی تۆ بەگەل گەلێ زۆرە
نەتەویستت ئەوێستێ سەرشۆڕە
گەنجەکانت گەلێ گەیاندوونێ
لە پلەی پێشی تا تەواو بوونێ
ئەو جحێڵانە گەرچی زۆر گەنجن
خۆ سپاس بۆ خوا هەموو گەنجن
سروەکەت چەشنی سۆزی کوێستانە
نێوی پڕمیوە ، باغ و بێستانە
ئەی جحێڵان و خوێندەوارانم
جێ هومێدی دێهات و شارانم
داخە سروە هەتیو بێ دوای هێمن
ئێمە شەرمەندەبین لە لای هێمن
ئینشاراتهی سەلاحەددین
سروە و مروە دەربخەن چین چین
لە وت و وێژەکانی با یاد کەین
گیانی مام هێمنیشی پێ شاد کەین
خاڵ و خەڵکێکی زۆری کرد ڕەشپۆش
خۆی کە ڕۆیی و تاری جوانی خۆش
جا ئەوێستا کە «خاڵە» دەس بە دوعا
بۆی بپاڕێینەوە هەموو لە خوا
ئەی خودای عاسمان وەهی هەردی
ئەی پەنا و پشتی میللەتی کوردی
هێمنە و هێمنیش بوو بێ بەخشە
ئەوی بی بەخشی خۆش و خۆشنەخشە

چون نووسەری ئەم وتارە" خوالێخۆشبوو سوارەی ئێلخانی زادە" نەماوە ئێمە دەستمان لـــە نووسراوەکە وەرنەدا

# سەیـــدەوان

کۆمەڵ لەسەر رێگای راستە و هەرچی لەنێو کۆمەڵەوە هەستێ وباسی خواست وویستی کۆمەڵ بکا جوانە. چونکوو ئەوەی وابە هەڵە دەچێ تاکە. کۆمەڵ کەمواهەیە رێگای چەوت بگرێتە بەر.

کۆمەڵ بەلای منەوە بەو کەمایەتی یە نالێن کە سوودێکیان هەیە جیا لە سوودی گشتی وهونەرێکیان هەیە بەپێچەوانەی هونەری کۆمەڵ.

چینی پێک هێنەر واتە ئەوکەسانە کە زوربەن و هەمیشە روویان لە ژیانی مرۆڤایەتی وبەرزکردنەوەی پلە وپایەی ژیانی ئینسانی یە.

بەلێکدانەوەی من کۆمەڵ بەوان دەگوترێ جوٚن ئەوانن کە خەمیان وەک تەموومژی سەر چیا وشادی یان چەشنی پێکەنینی هەوەڵ زەردەی، خۆرەتاوە. ئەوانن کە هونەریان ئێسک سووک ولە دڵ نزیک وخوێن شیرینە.

هونەرێک کە بە خشڵی خۆماڵی رازاوەتەوە ورەنگ و بۆن وتامی بێگانەی پێوە نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو شوێنێک ج لەنێوخۆ و ج لە دەرەوە هەرجوانە. چونکوو مانای بەرزی جوانی، ئەو جوانی یە کە بێوەندی بەهەرێمی بەریانی جوانیەوە هەیە ولەگەڵ «باشی»حاوەن یەک مانان لەهەموو لایەکەوە وبە لای هەموو کەسەوە بەرزە.

زیانی عێلاتی هەندێ خوو رەوشتی تایبەتی خۆی هەیە کە یەکیان دڵاوایی وبەخشین ومالێ دنیا بەلاوە کەم بوونە، جونکە ژیانەکەی چەشنێکە کە ئادەمیزاد بەرامبەر بەپاشەکەوت کردن و بیر لە بەیانی ژیان کردنەوە بێ دەربەست دەبێ. لەبەر ئەوەیە کە کورد سەربەرزی و ئازایەتی ومیوان گری زۆرە و بەیتی **سەیدەوان** داستانی ئەم چەشنە ژیانە دەگێرێتەوە

بەداخەوە ئەدەبی ئێمە لەنێو گەلانی جیهاندا بڵاو نەبۆتەوە. دەنا خواعالمە کە سەیدەوان زۆر لە "هاملێت"ی شکسپیر بەرزترە.

شکسپیر لای وایە "هەبوون یا نەبوون" مەبەست یەکێ لەو دوانەیە. بەیت بێژی سەیدەوان دەڵێ "دلان یا ماتەم" کامیان مەبەستی ژیانە؟

قارەمانی شکسپیر هاملێتی باوک کوزراوە، دایکی خەیانەتکار ومامی باوکوژ بوونە هۆی بەرازەی هاملێت بەڵام لەبەیتی "سەیدەوان" دا

باوکێک سێ کوڕی گەنجی دەمرن کە یەکێک هەر بە دەستی باوکەکە دەکوژرێ خەمی هاملێت بەئەندازەی پەژارەی عەبدولعەزیزی رۆڵە کوژراو گران نیە .

جا با بچینەوە سەرداستانی سەیدەوان .

"رەبی خودایە ئەتۆ هەوری رەحمەتێ بێنی لە لای قیبلەی مەمبارەکە.لە داوێنی فەڕەنگی یان لەسەر قەبری پیرخدری هەڵبڕێژی. کێ دیویەتی لەدەورەتی دەزەمانان بووک لەسەر سێ کوڕان را بچنەوە ماڵە بابیان بەکیژی ؟

عەبدولعەزیزی داسنی سێ کوڕی دەبێ بەناوی"سەیدەوان" و"نێچیروان" و" مەلکەوان" سێ کوڕی گەنج کە کاتی ژن هێنانیانە وسێ بووکیان بە رۆژیک بۆدێنن . عەشیرەتی داسنی هەموو لە شایی و زەماوەندا بەشدارن . مەلکەوان شەوی هەوەڵ پەردوو - گیر دەبێ ودەمرێ و خەفەتێکی گەورە دەخاتە سەر دڵی باوکی بەڵام عەبدولعەزیزە کۆرە سەرۆکی عێلی داسنی یانە! چۆن رووی هەیە بە عەشیرەتەکەی بڵێ :

- دەستی دیلان بەردەن و بڵاوەی کەن !

راستە کەکوڕمردن پشت شکێن و برست بڕە ،بەڵام ئەی"سەرۆکی‌چی، ئەی پیاوەتی ومیوان خۆشەویستی چ لێ بکا ؟

عەبدولعەزیز دەنگ ناکا و هەڵپەرکێ وزەماوەند هەر دەمێنێ ،تا شەوی دووهەم دەشتەوانان هەواڵی دەدەنێ کە نێچیروان لەرەوەزەبەردی تووش وچڕ هەڵدێراوە ومردووە دیسانەوە باوکی کۆست کەوتوو برینی دەکولێتەوە و خەم بە هەموو گرانی یەکەوە دەکەوێتە سەردڵی وبیر دەکاتەوە . دووکوڕی جوانەمەرگ بوون ئەم زەماوەندە شوومە .ئەم بەهارە بێ فەڕە بێ فەڕودزێوە .چی بکا ؟ئایا لە گەڵ ئەوەشدا تەرمی دووکوڕی لاوی لەبەر دەستە .زەماوەند هەربمێنێ ؟ ئەگەر بە داسنی یان بڵێ من زەماوەند ناگێڕم ئێوە هەڵپەرکێ بوەستێنن ، چی پێدەڵێن ؟

ئاخۆ نالێن عەبدولعەزیزە پیرەخەرفاوە ، پیاوێکی ئاخرشەڕە ؟ ئەمانە ژێردەستی خۆین.بێ جیاوازی کورە داسنی کوڕی ئەوون و هەموو ئەورۆ لە شادی ئەودا بەشدارن ،میوانن . گەڕی هەڵپەرکێ گەرمە ، کیژوکوڕی داسنی خەریکی رۆینە و سوێسکەیی وچۆپی وسێ جادن ، ئاخۆ بچێتە ناویان و بە پرمەی گریانەوە بڵێ ئەی کوڕوکیژی داسنی دیلانەکەتان بەردەن لەبانی شایی شین بگێڕن .مەلکەوان ونێچیروان مردن وئێوە بۆ دوو راوای . ئەماو شایی دەکەن . بەڵام نا عەبدولعەزیز کوردە . ئەوانەش میوانن . رەوا نیە زەماوەندەکەیان بشێوێ. ئەی دڵی پەژارەداری چ لێ بکا . ئەم هەموو خەموودەردە بۆکوێ بەرێ؟ واباشە لە ئاوایی دەرکەوێ .پەنا بەرێتە بەر داوێنی چیا خەفەتی بدا بەدەم شەماڵی سەرشێتی شین و دوعا! نا لەهەرای هەڵپەرکێ رزگاربێ ئاگری دەروونی بەجۆش دێ و دەبێ نا ئەو جێگایە وارێبازی مەڕ و بزنەکێوی یە لەژێر بەردێک ئارام دەگرێ ، بەڵام دڵی وەک ئاوی سەرئاگری بەتین دەجۆشێ وهەڵدەچێ . فرمێسکی گەرمی بەسەر گۆنای پرچینیدا دێتە خوار .

دەوروبەری بەهارە بەڵام چ بەهارێک ؟ بەهارێکی رەش وناحەز . ناحەزتر لە هەموو زستانێک ،چاوی تیژی وەک هەڵۆی پیری چیا دەڕوانێتە ئەوبەری دۆڵەکە . بەهانەی لەماڵ دەرکەوتن و کۆڕی زەماوەند جێ هێشتنی ئەمەیە کەدەچێ گۆشتی راوێک بێنێتەوە.

لێرەدایە کە تراژدی دەگاتە ئەوپەڕی خۆی . دەستێکی بەهێز لە کاردایە بۆ پەروەراندنی دڵتەزێن —

ترین بەسەرهات .

دەوروبەری بەهارە ،گیا شینە ،لاسکی ناسکی گوڵی کێوی بەدەم بای نەرمونیانەوە دەلەرێتەوە .دڵی ناوکێک پڕە لە مەینەت . پەردەی زاوایی دووکوڕی گەنج بەتاڵە دووبووک چاوەڕوانن. داسنی لەشایی و خۆشیدا نوقم بوون. عەبدولعەزیز گاهێ بەدڵیدا دێ " دوانم مردن ،سەیدەوانم ماوە . ژیان ماتەمە یا شینە ؟

دەنگی گۆرانی بێژ و دەهۆڵ و زوڕنای نێو دێ کە زۆر دوور ،لەدەرەوە دێتەبەر گوێ.ئەوجارە نەوا شەماڵ دەیهێنێ . دەڵێ "ژیان شایی یە دوان مردن!هەموو دەمرن! چونکە لە هەوەڵەوە نەبوون، هاتن‌وپاشان رۆیشتن .

کەوایە ژیان قۆناغێکی کەمخایەن وکورتە لە نێوان دوو نەبوونی درێژ وبێ بەستێندا .

---

هەراوبگرێکە بەینی دوو بێدەنگی وهەدادان کە وەهایە ژیان شایی یە . بۆ نەمانی بێدەنگی ماوە زۆرە ، بەلام دۆڵی کپ وخامۆش کە دەڵێی گریانێکی بەکوڵی پیاوانەیە لەگەروودا بەستراوە دەڵێ ... نا ... ژیان ماتەمە ژیان کۆست کەوتنە . ژیان لەگۆ کەوتنی دوولێوی پڕ بزەیە . با، لەو بەری دۆڵەکەوە یاری بە مووی ریشی زەردی بزنەکێوی یەک دەکا . لێکی دەدا .دەیهۆنێتەوە. عەبدولعەزیز بەچاوێکەوە کە فرمێسکی مەینەتی تێزاوە دەڕوانێتە ئەوموووەزەردانە کە دەڵێی برچی گوڵەبەڕۆژەیا قژی گەنمەکانەبە و با دەیشەکێنێ. وادەزانێ بەراستی مووی ریشی بزنە کێوی بە تەقەی تفەنگ هەڵدەستێ .وەک پڕمەی تڕبانێکی بەکوڵ دەچێ . نا دەڵێی قاقای پڕلە تەوسی ئینسانە بە ژیان . شتێکی زیندوو لەپشت بەردێکەوە دەکەوێتە خوارەوە . وادیارە پێکراوە . عەبدولعەزیز دەگاتە سەری دەبینێ سەیدەوانە . مووی زەردو خوێنی سوورو دەموچاوی سپی لەسەرگیای سەوز تێکەڵ بوون . هەناسە لە سینگی چیادا قەتیس ماوە . کەو لە قاسپە کەوتووە . رۆژ خۆی لەژێر هەورێکی چڵکندا شاردۆتەوە .

عەبدولعەزیز چی بۆ ماوەتەوە . دانیشێ چونکوو ئەژنۆی هێزی نیە . لە بێدەنگی دەترسێ وناشتوانێ بگری چونکوو پەشۆکاوە هەموو دنیا لەبەر چاوی دەبێتە یەک پرسیار ، ژیان شینە یا شایی یە ؟

غەم لەوە گەورەترە کە لەدڵی پیروناسکی عەبدولعە ـ زیزدا جێگای ببێتەوە دەپاڕێتەوە . لە بەرخودا دەپاڕێتەوە "رەبی خودایە بای رەحمەتێ بێنی لە لای قیبلەی موبارەک لە داوێنی فەرەنگی یان بیدەی لە خەمی عەبدولعەزیزی و لە بەحری خوێ یەی تێپەڕێنی چەند خەمێکی گەورەیە خەمی عەبدولعەزیزی داسنی کە دووکوڕی دەمرن ویەکێکی خۆی دەیکووژێ . لە کاتێکدا رەماوەندە ،بەهارە ، کاتی بووژانەوە وژیانەوە.بەیت بێژ ترازدی یەکی بەرزی پێک هێناوە .گیانی نەمری شاد بێ .

*ـولاتی داسنی : کەوتۆتە بەری بارزان جێگایەکی چڕوئەستەمە وکەوتۆتە نێوەڕاستی تورکیا و عێراق بزنەکێوی زۆر پێوەو جێگە راوە .

# ف-وەفایی

دایک وبابی خۆشەویست :

١ـ ئەوەت لەبیربێ کە منداڵ دیاری خوایەولەرێزی نیعمەتەبەرزەکانی ئەوەمەیەـ لێن هەویری ئەوبەتالبیاوک یابراودراوسێ دەربێ.هەر منداڵەی شەخسیەتێکی‌تایبەتی هەیە ودەبێ بۆنواندنی ئەو دەرفەت وماوەی بدرێتێ.

٢ـ وەختێک، منداڵ لە کارێک سەرناکەوێ یادەبەزێ نابێ بەخۆدا بشکێتەوە .یالەگەڵ ئەومنداڵانەی هاوتەمەنی کەلەوزیاتر گەشەیان کردووە هەڵی مەسەنگێننە .

٣ـ تووڕەیی ودژایەتی دووهەستی سروشتین جا منداڵەکەت یارمەتی بدە تا بۆهەڵوێستگرتن لەبەرامبەر ئەو دووهەستەدا رێگەیەک بدۆزێتەوە کەکۆمەڵ پەسندی بکا .دەنائەگەر تووڕەیی ودژایەتی خۆی بەشێوەیەک پێشان نەدا لەدەروونیدا کۆدەبێتەوە ودەبێتە ناسۆر وگریمانە .

٤ـ دەبێ منداڵ قایم‌و، ئاقڵ باربێ‌وفێری رێک وپێکی بێ. نابێ هەست بەوە بکا کەدایک وباب زوڵمی لێدەکا. چون ئەگەرزانی دایک وباب عادڵن،بەقسەیان دەکاو خۆشی دەوێن.

وەختێک سزادەدرێ دەبێ واهەست بکاکە تۆڵەی بەعەدالەت لێ دەکرێتەوە .

٥ـ وەختێ ئاموٚژگاری منداڵ قسەتان یەک بێ‌وانەبێ یەکتان لانی منداڵ بگرن و ئەوی دیکە دژی ئەوڕاوەستن چون دەبێتەهۆی ئاکامێکی نالەبار لەباری عاتیفەولەدەروونی منداڵدایانی‌وەختێک گەورەبووهەستەتێکدەرەکانی وەک تاوان وشەرمێونی ناهێمنی تێدابەدی دێ.

٦ـ هەرچی منداڵ ویستی وگرووی بۆگرت لەبەردەستی مەنێن چون دەبێ ماوەیەک ناڕەحەت بێ هەتا قەدری وەدەستهێنانی دڵخوازبزانێ وبۆگەیشتن بەخۆشی ناخۆشیش بچێژێ .بۆئەو کارانەی دەیەوێ بیکا خاترجەمی بکە .

٧ـ نابێ خۆتان بەسەر چاوەی هەمووتەواوەتی یەک بزانن.دەبێ منداڵ هەست بەوە بکا کەدایک وبابیش هێندێک شت دەزانن وتوانایی‌هێندێک کاریان هەیەوهێندێک نا.دەبێ ماوەی بدەی نابزانێ دایک وباب هەڵەش دەکەن ئەوددم، پێوەندی گرتن لەگەڵ منداڵ سانی تروخۆشترە .

٨ـ وەختێک تووڕە بوون هەڕەشەمەکەن ووەختی خۆشی دڵێنی یەک مەدەن کەدوایی

